# کۆپی کردنی مرۆڤ
# و
# مەترسییەکانی



نووسینی
أنور أحمد مصطفى

2007
هەولێر

# پێرست

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی :

*الحمدلله رب العالمين الذي خلق الانسان من علق و علمه ما لم يعلم .
* والصلاة والسلام على سيدنا و حبيبنا محمد (ﷺ) المبعوث رحمة للعالمين . وعلى آله و صحبه الطيبين الطاهرين ومن دعا بدعوتهم الى يوم الدين .        آمـــين

أما بعد :

مرۆڤ خوای گەورە بەشێوەیەك دروستی كردووە و بەدی هێناوە كە خاوەنی توانایەكی بەهێزی داپۆشراوە و بە بەدیارخستنی ئەو توانایە مرۆڤ دەتوانێ بگاتە ئاستێكی یەكجار بەرز و داهێنانی تازە بەدەست بێنێ .

ئاینی پیرۆزی ئیسلام خەڵكی هەڵدەنێ بۆ ئەوەی تواناكانیان بخەنە گەڕ تا كەسانێكی زانا و رۆشنبیر و داهێنەربن لەچەندین ئایەتی قورئانـدا داواكـراوە تـا بیـنین و بیـستن و ژیـری بخرێتەگـەڕ و هەنگاوەكان بەرەو پێشەوە بنرێن بەشێوەیەك ئەو كەسەی كە دورۆژی وەكو یەكتر وابێ و هیچ گۆڕانێكی بەرەو باشتر پێوە دیار نەبێت لەشەریعەتی ئیسلامیدا بە كەسێكی زەرەرمەند دادەنرێت .

بێ گومان ئەو پێشكەوتنە زانستیەی ئەمڕۆ مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دەبینێت لە هەموو بوارەكانی-وەكو-زانستەكانی-بولوجیا (الأحياء) و زانستی (أجنة البشرى) و زانستی (الخلايا) و زانستی-استنساخ-

هەموو ئەوانە و چەندانی تر لەو پێشکەوتنە زانستیانە ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر شتێك ئەوا بەڵگە و دەلیلە لەسەر گەورەیی و دەسەڵات و کارجوانی خوای گەورە و ئەو دەستور و یاسا وردەی بۆی دانراوە لەلایەن خوای میهرەبانەوە .

وە ئەو شتانەی کە بەدەست هاتوون و بەدەست دێن لە زانستە جیاجیاکان چ لە گژ و گیا و ئاژەڵ و مرۆڤ و هتد دا بە گیاندار و بێگیانەوە ئەوە بەشێکی زۆر کەمە لەو شتە نادیارە زۆرانەی کە خوای گەورە لەم کەون و بونەوەرە دا دروستی کردووە .

خوای گەورە راستی فەرمووە ﴿ وما أوتيتم من العلم إلا قليلا ﴾ واتە : پێتان نەدراوە لە عیلم وزانست تەنها بەشێکی کەم نەبێت کەوابوو ئەوە پەردە لادانە لەسەر بەشێکی زۆر کەم .

لێرەدا دەرکەوت هەتا زانست هەنگاوی زیاتر بەرەو پێشەوە بنێت بەڵگە و دەلیل لەسەر دەسەڵاتی بێ سنوری دروست کەری بوونەوەر زیاتر دەبێت و باوەڕدار زیاتر باوەڕ و ئیمانی دامەزراوتر دەبێت .

خوای گەورە ئاماژە بەو بوارە دەکات و دەفەرموویێت :

﴿سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم انه الحق ...﴾ واتە : دەسەڵات و توانای خۆمان پیشانی مرۆڤەکان دەدەین لە بوونەوەرو دەروونی خۆیان دا تا بۆیان روون ببێتەوە کە ئەوانە راست و دروستن .

ئەو حەقیقەتە ئیمانیەی لای موسڵمان چەسپاوە بە زانایان و خەڵکانی ئاساییەوە ئەوەیە: هەر چەندە مرۆڤ بەرەو پێش بچێت و

رۆژ بەرۆژ لە دۆزینەوە و داهێنان و تازەگەریدا بێت ، لە ئێستا و داهاتوودا ، هەر لەسنوری ئەو چوارچێوەیە دا دەتوانێت ئەسپی خۆی تاوبدات کە خوای گەورە ویستی لەسەرە مرۆڤ پەی پێ ببات وەکو دەفەرمووێ : ﴿ولا يحيطون بشيء من علمه إلا بما شاء﴾ بقرة٢٥٥

واتە : هیچ کام لە دروستکراوان زانست و زانیاری تەواویان نیە دەربارەی زانیاری و زانستەکانی ئەو ، مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت فێریان بکات (ئەم پێشکەوتن و زانستەی سەردەم بەشێکی کەمن لە بەخششەکانی خوا) .

تەنانەت فریشتەکانیش دان بەو راستیەیە دادەنێت

- ﴿قالوا سبحانك لا علم لنا إلا ما علمتنا انك انت العليم الحكيم﴾ بقرة٣٢

واتە : فریشتەکان ووتیان : پاکی و بێگەردی و ستایش هەر شایستەی تۆیە ، ئێمە هیچ زانستێکمان نیە ، تەنها ئەوە دەزانین کە تۆ فێرت کردووین ، بە راستی تۆ پەروەردگارێکی زانا و دانایت.

## – فۆتۆکۆپی کردن لە زمانەوانی و زانست دا–

ئـەو چـەمکە چـەندین پێناسـەی جیـاوازی بـۆ کـراوە ئەمانـەی لای خوارەوە هەندێکیانن:

*بەواتای هێنانەبونی هاوشێوەیەك دێت لەم بوونەوەرە زیندووەدا[1]

*بەواتای چرۆ یان بەرهەمی لەدایك بوو دێت

*لەزانـستی زیندەوەرزانیـدا بـۆ دەربڕینـی دیاردەیـەکی ناسـراوی بەرفراوان لە سروشتدا بەکاردێت کە بریتییە لەزۆربوونی هەندێك لـە زینـــدەوەران لەرێگـــەی دووکـــەرت بـــوونی خانەکانـــەوە بـــەبێ پەیوەندییەکی زایەندی.

*بەواتایەکی دی بریتـی یـە لـە بەرهـەم هێنـانی چەند وێنەیـەك لەیـەك سەرچاوەوە کە هاوشێوەن لەرووی پێکهاتەی بۆ ماوەیەوە [2]

ئەم دیاردەیەی باسمان کرد لە زۆربوونی مرۆڤیشدا دەبینرێت کاتێك کە هێلکەیەکی پیتێنراو دووکەرت دەبێت و لـە ئەنجامـدا دوانەیـەکی وەکـو یـەك لـە سیفەتە بۆ مـاوەی یەکانـدا دروسـت دەبێـت کـە ئێـستا نزیکەی (١٠٠)ملیۆن مرۆڤ لەو شێوەیە هەیە لەجیهاندا. [3]

---

-١- حکم الشرع في الاستنساخ و . . . عبدالقديم زلوم .

-٢- مجلة الطبيب - ملحق المجلة الطبية العراقية – عدد (١)١٩٩٧

-٣- مجلة المجتمع عدد (١٣٤٤)سالی ١٩٩٧

# هەنگاوەکان

چەندین ساڵە زاناکان ئەم کرداری کۆپی کردنە لەبواری ڕووەك و کشتیاریدا جێبەجێ دەکەن و توانییویانە بەرهەمی باش پێشکەش بکەن لەو بوارەدا .

بۆ نمونەمتوربەکردن ( پێوەند)

ئەنجامدانی ئەم کردارە لەسەر ڕووەك سوودی زۆری بووە لە زۆرکردنی بەرهەم و دەرگای والآکردووە بەڕووی دانانی چەندین بەرنامەی بەسوود بۆ پەروەردەکردنی ڕووەك و پارێزگاری کردن لەو سیفەتە بۆ ماوەی یانەی کەمرۆڤ حەزیان پێ دەکات و نایەوێت لەناو بچن .

لە سەرەتادا ئەم کارە ئەنجام دەدرا لەڕێی هەڵگرتنی تۆوی چاك و بە کەڵك بۆ ساڵی داهاتوو پاشان وردە وردە برەوی زیاتری پێدرا ئەویش بە چاندنی شانەکان (زرع الانسجە)لەڕێی هێنانی خانەیەك لە ڕوەك و زۆر کردنی لە تاقیگە (مختبر) کە لە ئەنجامدا نوسخەی تری لێ دەست دەکەوت ئێستاش لەم سەردەمەدا دەتوانرێت ئەنجامی زۆر باش بەدی بهێنرێت لەرێگەی بەکارهێنانی تەکنیکی تازە و نوێ لەو بوارەدا .

-پاشان هەوڵەکانیان چڕ و پڕتر کرد و دەستیان کرد بە تاقیکردنەوە و ئەزموون بۆ چارەسەرکردنی نەزۆکی و چارەسەرەکانی تری کۆ ئەندامی زایەندی مرۆڤ .[-١-]



وێنەی یەکێك لە زانایانی بواری بۆماوەیی( الوراثة) لە ناو تاقیگە دا

-لەسەرەتای ئەم سەدەی (٢١)ە دا دەست کرا بە لێکۆڵینەوە و ئەزمون لە بواری-التحسين الوراثي-لە ئەوروپا و ئەمریکا .

مەبەستیش لەو لێکۆڵینەوانە بریتی بوو لە دانانی-مۆدێل-بۆ مرۆڤ بە شێوەیەك دەیان ویست نمونە بەشەرییە حەزلێنەکراوەکان لەناو بەرن و حەزلێکراوەکان بهێڵنەوە

- لەوپێناوەدا لە ئەمریکا (٨٠) هەزار کەس لە ناوبرا [-٢-]

- لە ئەلمانیا (٥٠)هەزار مرۆڤ لەناوبرا لەسەر دەستی هیتلەر [-٣-]

-توانرا لەساڵی-١٩٥٣-ترشی ئەمینی بدۆزنەوە و پاشان زیاتر فراوان بوو بوو بەلقێکی زانستی-هەر لەو ساڵەدا دەستکرا بە وێنەگرتنەوەی -جینەکان-بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی-روبرت

---

[-١-] گۆڤاری خاوێن . ل ٥٧ . ژمارە ١٥-١٦

[-٢-] الاستنساخ جدل العلم والدين والاخلاق

[-٣-] گۆڤاری المجتمع -عدد-١٣٤٤

برینجر و تۆماس کنگ کرداری فۆتۆکۆپی کردن لەسەر گیانداران کرا کە بریتی بوو لە بۆقێك.

پاشان هەوڵەکان بەردەوام بوون تا لەمانگی شوباتی ساڵی ١٩٩٦-دا زانای سکوتلەندی-ایان ویلمون-لەدایك بوونی بەرخێکی ئاشکرا کرد لەرێگەی وێنەگرتنەوەی جینەکانەوە فۆتۆکۆپی کرابوو ناویان نا (دۆڵی) پاش ماوەیەکی کەم(قۆڵی)یش کۆپی کرا ؟



وێنەی ( دۆڵی و بۆنی )

شایانی باسە دۆلی پێش ئەوەی کە تەمەنی کۆتایی بێت دوای کەڵ خواردنی لە بەرانێك ئاوس بوو، پاشان لە ٢٣ ی نیسانی ساڵی ١٩٨٨ بە رێگەی سروشتی بەرخێکی بوو ناویان لێنا (بۆنی)



وێنەی(موراغ) و (میغان )

لە پێش کۆپی کردنی (دۆڵی)دا کۆمەلێك لە زانا (سکۆتلەندیەکان ) لە پەیمانگای (رۆزلین) ساڵی ١٩٩٥ هەڵسان بە کۆپی کردنی دوو کاوڕ بە ناوەکانی(موراغ) Morag و (میغان)Megan کە لە وێنەکەدا دیارن .

ئەم کۆمەڵەیە بە سەرۆکایەتی (کاید کامبڵ) کارەکانیان ئەنجام دەدن وبە ڕچە شکێن وپێشەنگی کۆپی کردن ناو دەبرێن.

– لە پاش کۆپی کرنی (دۆڵی) هەوڵەکان بەردەوام بوون تا سەرئەنجام کۆپی کردنی (مۆڵی)ش ڕاگەیەنرا ،

پاشان دەستەیەکی تر لە زانایانی پەیمانگای (الوطني الفرنسي) بۆ لێکۆلینەوەی کشتوکالی لە ئازاری ١٩٩٨ هەڵسان بە کۆپی کردنی کاورێکی مێ و ناویان نا(مارغریت) . لەگەڵ ئەمەش دا لێکۆلەرەوە ئەمریکیەکان لە سەرووی



وێنەی (مارغرێت)

هەمووشیانەوەزانای ناودار(جایمس ڕۆبڵ)لە زانکۆی (امرست ساکۆزیت) لە کێلگەیەك دا هەڵسان بە کۆپی کردنی چوار بەرخ لە ساڵی١٩٩٨ی مانگی ئایار کە تاکو ساڵی ٢٠٠١ سێ لە بەرخانە زۆر بە ئاسایی ولەش ساغیەکی تەواو دەژیان و دووربوون لە نەخۆشی.

–ئەم کارە بارودۆخی هەژاند و بووە جێگەی باس و خواسی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و هەتا مەسەلەی فۆتۆکۆپی کردنەوە هەموو جیهانی سەرگەرم کرد و بایەخی لە زۆر مەسەلەی‌تر دوورخستەوە و زاناکان بوون بە دوو تاقمەوە بەشێکیان قبوڵیان دەکرد و بەشێکی تریشیان ڕەتیان دەکردەوە و دژی دەوەستان چونکە پێیان وابوو ئەمە هەنگاوێکە بۆ کۆپی‌کردنی مرۆڤ .

# ئەگەری کۆپی کردنی مرۆڤ

ئەگـەری تاقیکردنـەوەی-فۆتۆکـۆپیکردن-لەسـەر مـرۆڤ بەشـێك لـە زانایـان و شـارەزایان ئەمـە زۆر بەتونـدی رەتدەکەنـەوە و پێیـان وایـە مەترسی‌یەکی گەورەیـە بـۆ سـەر کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی وە بەشـێکی تریـشیان پێیـان وایـە ئـەم کـارە ئەگـەر بەمەبەسـتی دەستخـستنی ئەنـدامی(یـەدەگ) (قطـع غیـار)بێـت بـۆ چارەسـەرکردنی مرۆڤـە نەخۆشەکان ئەوە شتێکی باشە . هەڵسان بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئەندامی یـەدەگك تاقیکردنـەوەیان ئەنجامـدا لەسـەر گەشـەپێکردنی-خانـەکانی لەشـی مـرۆڤ لـە پێـستەوە هـەر چـەندە نـەیانتوانی ئـەو خانانـەی کـە پێویـستی زۆرینـەی مرۆڤەکانـە گەشـەی پـێ بکـەن وەك ئەندامەکانی-گورچیلە و دڵ و جگەر و مۆخ و هتد .....

زاناکـان پێیـان وابـوو ئەگـەر هەوڵـەکان بـەردەوام بێـت رێـی تێدەچـێ مرۆڤیش فۆتۆکۆپی بکرێت-هەر چەندە ئەمە کارێکی نیمچە دەگمـەن بوو بەلایانەوە چونکە ئەو ئەزمونەش کە بەرهـەم هێنـرا لـە ئاژەڵدا بـە تایبـەت لەسـەر-دۆڵـی-کـە لەسـەر دەسـتی زانـا سـکۆلەندی‌یەکان بەرهەم هێنرا .

-٢٧٦جـار هـەوڵی فۆتۆکـۆپی کردنیـان دا-پاشـان بۆیـان دەرچـوو کەواتە رێژەی سەرکەوتن لە شیردەرەکاندا لە ٥٪ کەمترە [١]

[١] گۆڤاری گولان ژمارە -٤١٦-ل ١٤

بۆیــە ئاوســبوون بــە رێگــەی نائاســایی-واتــا-بــێ پیتانــدنی هێلکۆلەبــەتۆو) پێویــستی بــەگۆڕانکاری کیمیــاوی زۆر ئــاڵۆز هەیــە چــونکە دەبێــت خانەیــەکی تایبەتمەنــد بــە ئەنــدامێکی دیــاریکراو بگۆڕێت بۆ خانەیەکی ناتایبەتمەند.

-ئایــا فۆتۆکــۆپی مرۆڤــەکان دەبێــت یــان دەگونجێــت لــەبیری توێژەرانی(جینات)لە سەدەی (٢١)دا بەڵێ بێگومان وایە ، زۆر کەس کە تاوتۆی دەکەن دەڵێن ئەمە تەنها درێژەی ئەو هەولانەیە کە بۆ چارەسەری نەزۆکی و چارەسەرەکانی تری کۆ ئەندامی زایەندی مرۆڤ لە ئارادایە ، ئەو کەسانە وای بۆ دەچەن کە ئەو بەرگرییە رواڵەتیەی کۆمەڵگا دەیکات زیاتر و توندتر نییە کە بەرامبەر پیتێنی دەستکرد (مناڵــەکانی شوشــە) دەیــان کــرد کــە ئــەم جــۆرە زانــستە (پیتێنــی دەســتکرد) بۆتــە توێژینەوەیــەکی بــەربڵاو و وەچارەســەری زیــاتر لــە (٢٧)هــەزار نــەخۆش لــەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٩و ١٩٩٩ لــە بــەریتانیادا تەنها بە هۆی ئەم توێژینەوەوە بووە ....بەڵام فۆتۆکۆپی کردنی مرۆڤ مەترسییەکی وەهای وروژاندووە کە بەهیچ شێوەیەك ناپێورێ [-٢-]

-(رودلف جانگێتش)لە پەیمانگەی مساشویتیس بۆ تەکنەلۆژیا)وای داناوە کە پێنج لە هەر یەکەم سەد هەوڵ سەرکەوێت ئەم بابەتانە بابەتێکی لاوەکین ئەگەر بەراوردبکرێت بەرامبەر بەو هەست کردن بــەترس و دڵەراوکێیــەی ئــەم بیرۆکەیــە خوڵقاندوویــەتی لــەناو ئــەو

[-٢-] گۆڤاری خاوێن ژمارە ١٥-١٦-ل ٥٧

کۆمەڵگایانەی کە فۆتۆکۆپی کردنی مرۆڤ وەك بیرۆکەیەك بۆتە کارێکی واقیعی و دوور لە گومان [١]

جا بابزانین فۆتۆکۆپیکردنی مرۆڤ چی یە و ئایا لە ڕوانگەی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامەوە چۆنە حەلاڵە یاخود حەرامە فۆتۆکۆپی -استنساخ-ی مرۆڤ بەوە دەووترێت کە لەمرۆڤێکەوە مرۆڤێکی تری هاوشێوەی وەکو خۆی دەربهێنرێت و بەرهەم بهێنرێت.

و. لە ڕووی شەرعیشەوە لەبەر ئەوەی کۆپی کردن چەندج جۆرێکە ، شەریعەتی ئیسلامی بۆ هەریەکەیان حوکمێکی تایبەتی هەیە لە ڕووی ڕێپێدان وقەدەغە کردن .

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل-٥٨-

# جۆرەکانی فۆتۆکۆپی کردنی مرۆڤ

**دیاره ئەو فۆتۆکۆپی و وێنەگرتنەوەی مرۆڤ کە باسمان کرد خۆی لە چەند جۆرێکدا دەبینێتەوە ئێمە بەیارمەتی خوای گەورە دوو جۆری سەرەکی لێ باس دەکەین و لەوێشەوە چەند لقێکیان لێدەکەینەوە و بەکورتی لەسەریان دەدوێین بەپێی توانا .**

١-پێی دەووترێت- التكاثر الجنيني-

**واتا بریتی یە لەو خانە پیتێنراوە کە بریتی یە لە تۆوێکی پیاو و تۆوێکی ئافرەت ، ئەم خانەیە کە بە ئینگلیزیەکەی پێی** دەلێن **زایگۆت، وە لە قورئانیشدا بە ( نطفة امشاج) هاتووە وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ:** ﴿انا خلقنا الانسان من نطفة امشاج نبتليه فجعلناه سميعا بصيرا﴾الانسان ٢ **واتە : بێگومان ئێمە ئینسانمان دروست کرد لە تێکەلەیەك (لە سەرەمێکوتەیەکی بچوك و هێلکۆکەیەك) لە کاتیکدا دەمانەوێت تاقی بکەینەوە ، هەر بۆیە دەزگای بیستن و بینینمان پێ بەخشی .**

**-ئەم خانە پیتێنراوە دەبێتە دووان ، پاشان دەبێتە چوار دوایی دەبێتە-١٦-، و . . . ئاوا بە ثنائی وردە وردە زیاد دەکات لەتاقیگە کەدەبێتە (٤خانە)وردە وردە جیایان دەکەنەوە لەیەك هەندێك قەوزەی ناو دەریا دەهێنن ( چونکە بەدەست دەشکێت ) ئەبێتە چوار خانەی جیاواز، ئەم چوار خانەیە ئەگەر بچێنرێت لە رەحمدا (٤مرۆڤ)دروست دەبن کە لەیەك دەچن ، ئەم بەشەیان لەرووی شەرعەوە-والله اعلم- وەکو جەنابی مامۆستا-حاجی شەمال مفتی لە کۆباسەکانی**

**میحرابدا لە ژمارە (١-٥) کە کراوەتە (١) کتێب لە لاپەڕە-(٣٧٨)دا دەفەرمووێ-ئەم بەشە هیچ کێشەیەکی شەرعی تێدا نی یە بە مەرجێك ئەو تۆوە لەژن و مێردەوە هاتبێت ئەمە ئەچوێندرێت بەو منالأنەی کە لە (تیست تیوب) دا دروست دەبن ، لە (انبوب الاختبار) دا ئەویش کێشەیەکی شەرعی تێدا نی یە ، بەدوو مەرج-**

**. یەکەم - ئەو تۆوە لەژن و مێردی یەکتر بێت .**

**دووەم- نەچیندرێت لە رەحمێکی تردا تەنها دەبێت لە رەحمی دایکەکەدا بێت واتا رەئی شەرعی بەرامبەر ئەم حاڵەتە بەو دوو مەرجە دروستە.**

**٢- فۆتۆکۆپی کردنی بەشێك لەمرۆڤ**

**ئەمەیش خۆی لە دوو بەشدا دبینێتەوە بەشێکیان خێرە و بەرژەوەندی زۆری مرۆڤەکانی تێدایە بۆ نمونە لە لەشی مرۆڤدا- هۆرمۆنێك هەیە پێی دەووترێ ( انسۆلین)هەر کاتێك ئەو هۆرمۆنە لاواز بوو لە لەشدا خاوەنەکەی تووشی نەخۆشی شەکرە دەبێت- زانست بۆی ئاشکرا بووە کە هەربەشێك لە لەشدا کە دروست دەبێت دەگەڕێتەوە بۆ دوگمەیەك ناوی لێنراوە (جین) لە زانستدا-واتا جینێك لێپرسراوی ئەنسۆلینە لە مرۆڤدا-لەتۆزێك پێستی مرۆڤەکەوە ئەو دوگمە-(جین)دەگوازنەوە و دەیخەنە ناو بەکتریایەك ئەو بەکتریایە دەست دەکات بەدروست کردنی ئەنسۆلین ئەو ماددەی ئەنسۆلینە بەشێوەی دەرزی لەو کەسانە دەدرێت کە نەخۆشی شەکرەیان هەیە .**

وه هەروەها (جینێك)یتر لێپراسراوه لە ماددەیەك كە پێی دەڵێن (ئینتەرفیرۆن) لە لەشی مرۆڤدا–ئەم ماددەی ئینتەر فیرۆنه ئەگەر خانەی شێرپەنجه دروست بوویێت پەلاماری دەدات واتا بەرگری لە لەش دەكات ، ئەو جۆره گرانه تایانه ، ئەو جۆره هەوكردنانەی جگەر كه پێی دەگووترێت–(هێپا تایتس C,B) كە كوشندەن ئەو ماددەیه پەلاماریان دەدات ، بەلاّم زۆرجار هەوكردنەكه زۆر بەهێزه ئینتەر فیرۆنەكە كەمە و دەرەقەتی نایە و وه توانای بەرگری كردنی نییه زاناكان دێن ئەو جینەی لێپرسراوی ئینتەر فیرۆنە و دروستی دەكات دەری دەهێنن و دەیخەنە ناو خانەی بەكتریایەكەوه دەست دەكات بە دروست كردنی ئەو ماددەی ئینتەر فیرۆنه و پاشان كۆ دەكرێتەوه به دەرزییەك دەدرێت لە مرۆڤە نەخۆشەكە وه جینێك هەیە لە ئافرەتدا لێپرسراوه لە دروست كردنی (پرۆتین)لە شیردا دێن ئەو جینه دەگوازنەوه ناو (مانگا)چێڵ شیری ئەو مانگایەی جینەكەی بۆ گوازراوەتەوه پرۆتینەكەی هی مرۆڤە نەك هی ئاژەڵ وه سوودی زۆر زۆر زیاتره بۆ منالٚ لە شیره ئاساییەكە .

وه هەندێك جینی تر كەلێپرسراون لە ئەندامەكانی وەكو جگەر و گورچیله و دڵ و هتد ئەیان گوازنەوه بۆ ناو ئاژەڵ ، بۆ بەراز ، گوێرەكه و مەڕ و هیتر بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤەی كە پێویستی بە یەكێك لەو ئەندامانە دەبێت هی ئەو ئاژەڵانەی بۆ بگوازنەوه چونكە سیفاتی مرۆڤیان تێدایە و دەگونجێت بۆ مرۆڤ -١-

[1] كۆ باسەكانی میحراب –ژمارە– ١–٥

-ئەم چەند نمونەیەی باسم کردن هەموویان لە لایەنە باشەکەیەتی و (والله اعلم ) لەرووی شەرعەوە رێپێدراوە بەلاّم بە چەند مەرجێك چونکە ئەمانە چارەسەرن و چارەسەر و تەداویش لە شەریعەتی ئیسلامدا بە سوننەت دانراوە وەکو لە چەندین ئایەتی قورئانی و فەرمودەی پێغەمبەردا ئامارەی پێکراوە و خەڵکی هەڵدەنێت تا بەدوای چارەسەردا بگەرێت .

لە قورئاندا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿واذكر عبدنا ايوب اذ نادى ربه انى مسني الشيطان بنصب وعذاب ، اركض برجلك هذا مغتسل بارد و شراب﴾ (ص ٤١-٤٢)

واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) سەرگوزشتەی بەندەی ئێمە (ئەیوب) بۆ ئۆمەتەکەت باس بکە ، کاتێك بانگی لە پەروەردگاری کرد ووتی : بێگومان شەیتان تووشی نەخۆشی و ئازاری کردووم ...

ئێمەش دوعاو نزامان گیراکرد و وتمان : هەستە ، بە پێی خۆت رابکە ، ئەوە ئاوێکی ساردە بۆ خۆشوشتن و خواردنەوە .

-پێغەمبەر (ایوب)علیه الصلاه والسلام

نەخۆشییەکەی زۆری بۆ هێناو و داوای کرد لە خوای گەورە و سکالاّی خۆی لای ئەو کرد خوای گەورەش فەرمووی هەڵسە برۆ ئەوە ئاوێکی ساردە لێی بخۆرەوە قاچەکانتی پێ بشۆرە یان لە واتایەکی تری ئایەتەکەدا هاتووە خوای گەورە فەرمووی بە حەزرەتی ایوب قاچەکانت بدە بە زەویدا و ئاوێکی سارد دەردەچێ . . .

لەم ئایەتە پیرۆزەوە دوو شتی زۆر گرنگ فێردەبین :

١-گرتنه بەری هۆكار بۆ چارەسەری نەخۆشی .
٢-خوای گەورە شۆرینی پێیەكانی حەزرەتی ایوبی كردە مایەی رزگاربوونی لە نەخۆشی یەكەی .
-پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەكدا دەفەرموێ: **ما انزل الله داء الا انزل لە شفاء** / رواه البخاري واتە : **خوای گەورە هیچ دەردو نەخۆشیيەكی نە ناردووە ئیللا چارەسەرێكی بۆ ناردوە.**
كەوابو خوای گەورە نەخۆشی و چارەسەرەكان بە دەستی ئەوە ، وە هیچ نەخۆشی و دەردێكی دانەناوە بەڵكو چارەسەرێكی لە بەرامبەریدا داناوە. روي ابو داود و ابن ماجە عن اسامە بن شريك : **كنت عند النبي وجاءت الاعراب، فقالوا : يا رسول الله انتداوي ؟ فقال نعم ، يا عباد الله تداووا فان الله عزوجل لم يضع داء الاوضع لە شفاء...** واتە : من لای پێغەمبەر (ﷺ) بووم كۆمەڵێك پیاوی دەشتەكی هاتن وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئەو كاتەی كە نەخۆش دەبین خۆمان چارەسەر بكەین ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بەڵی ، ئەی بەندەگەلی خوا چارەسەر بكەن چونكە خوای گەورە هەر دەردێكی ناردبێت دەرمانێكی بۆ ناردووە .
ابن القيم-خوای گەورە دەرەجاتی عالی بكات دەفەرمووێ (هەر شتێك خێری كۆمەڵی تێدابێت ئەوە دینە ئەو شەرعە ، وە هەر شتێك كە زەرەری تێدا بێت بۆ مرۆڤ و بۆ كۆمەڵ ئەوە دژی دینە و شەرع نیيە).
- وەبەشی دووهەمیان كە خراپەو لە شەریعەتی ئیسلامیدا حەرامەو رێپێنەدراوە - ئەوەیە كە دێن مرۆڤێك فۆتۆكۆپی دەكەن - وەكو

ئەوەی پیاوێك یان ئافرەتێك دەیەوێت کەسێك لە خودی خۆیەوە دروست ببێت وەکو خۆی وابێت لە هەموو سیفا تەکانیدا –

- ئەویش بەبەزاندنی سنوری پیتاندنی هێلکە بەتۆ وە لادانی لەرێگەی سروشتی خۆی .
- بۆ نمونە خانەکانی لەشی مرۆڤ پێك هاتووە لە دووجۆر خانە

١–خانەی زاوزێ – خلایا جنسیە –

کە لەتۆوی نێر و هێلکۆکەی مێ پێك دێت وهەریەکێك لەوانە (٢٣) تاك کرۆسۆمیان تێدایە بۆیە کاتێك لەوریگە سروشتیەیەی کە خوای گەورە دایناوە پێك دەگەن ژمارەی کرۆسۆمەکان لە هێلکە پیتێنراوەکە دا دەبێتە (٤٦) کرۆسۆم (٢٣) ی دایك و (٢٣) ی باوك چونکە هەر خانەیەك لەلەشی مرۆڤدا نیوەی سیفاتە (وراثي) بۆماوەی یەکانی دایك ونیوەی سیفاتی باوك هەڵدەگرێت بۆیە دەبینی کاتێك منداڵێك بەرێگەی سروشتی لە دایك دەبێت لەدایك و باوك و بگرە نزیکانیشیان دەچێت لەبەر ئەوەی کرۆسۆم تایبەتە بەگواستنەوەی سیفاتی بۆ ماوەیی لە باوانەوە بۆ وەچەکان .

٢–خانەی لاشەیی–خلایا جسدیە–

خانەی لاشەیی بریتیەیە لەو خانانەی کە لەشی مرۆڤ پێکدێنن زاناکان دەڵێن بە ملیۆن و بلیۆن خانە لەلەشی مرۆڤدا هەیە ئەوان دێن لە پێستی مرۆڤێکەوە تەنها خانەیەك وەردەگرن و بەس تەنها ئەو خانەیە خۆی (٤٦)تاك کرۆسۆمی تێدایە واتا هەموو سیفاتە (خلقی)یەکانی کە خوای گەورە لەمرۆڤدا دروستی کردووە–وەکو بالاً

و رەنگـی چـاو و قـژی سـەر و مـۆری پەنجـە و زرنگـەی دەنگـی و سەرجەم سیفاتەکانی تری هەمووی لەو خانە وەرگیراوەدا هەیە

دوای وەرگرتنی خانە پێگەیشتووەکە ناوکەکەی لێ دەردەکەن پاشان دێـن هێلکۆکـەی ئـافرەتێکیش وەردەگـرن و ناوکەکـەی دەردەهێـنن بەشـێوەیەك کـە تـەنها سـایتۆپلازمەکەی دەمێنێتـەوە-پاشـان-ئـەو ناوکە (نوات)ە کە لە خانەکەوە وەرگیراوە دەیخەنە ناو ئەو هێلکۆکە نەپیتراوە بەتاڵکراوە لە ناوك وە ئەم دوو خانەیە یەك دەگرن بەهۆی تەزویەکی کارەباییەوە هەروەك چۆن لەکاتی ئاسایی و سروشتی تۆ و هێلکە یەکدەگرن وە هێلکەی پیتراو پێکدێنن .

کەواتە بەم کرداره ئەو هێلکە بەتاڵکراوە لە ناوکەکەی بەرمەجە دەکرێتەوە بەیەککگرتنی لەگەڵ ناوکی ئەو خانە لاشەییە کە (٤٦) کرۆسۆمی تێدایە پاش گەشەکردن و نەش و نماکردن نوسخەیەکی هاوشێوەی خاوەن ناوکە وەرگیراوەکە دەردەچێت . [-١-]

ئەمیش جیایە لەگەڵ لەدایك بوونی سروشتی چونکە

١-لەدایك بوونی سروشتی بەهۆی خانەی زاوزێوە دەبێت بەلاّم فۆتۆکۆپی کردن بەهۆی خانەی لاشەییەوە دەبێت .

٢-رێگەی سروشتی کاتێك تۆوی پیاو-حیوان المنوی-کە پێکهاتووە لە (٢٣)کرۆسۆم-دەگات بە هێلکۆکەی-بیوضـة-ی ئافرەت کە ئەویش پێکهاتووە لە (٢٣)کرۆسۆم بەیەك گرتنیان ئینجا منالێك پێك دێنن کە سیفاتی بۆ ماوەیی دایك و باوکەکەی تێدایە.

---

[-١-] وێنەگرتنەوەی مرۆڤ لەنێوان ل-٩-

بەلاّم رێگەی فۆتۆکۆپی ئەو منداڵەی دەبێ تەنها سیفاتی ئەو کەسەی تێدایە کە خانەکەی لێ وەرگیراوە لە ١٠٠٪ لەو دەچێت .
٣-رێگەی سروشتی بەبوونی هەردوو رەگەز واتە ژن و مێرد دەبێت بەلاّم کۆپی بەنەبوونی رەگەزی پیاویش هەردەبێ وەکو ئەوەی خانەکە لە ئافرەتەوە وەربگیرێت و هەر لە ئافرەتیشدا پێك بهێنرێت .
-لەروویەکی ترەوە دەیانەوێت مرۆڤ دروست بکەن لەرێگەی فۆتۆکۆپی کردنەوە وەکو شمەکی یەدەگ (ادوات احتیاط) دوای لەناوی بەرن و پارچەکانی دەربهێنن بۆ مرۆڤێکی تری نەخۆش-لەرۆژئاوا خەڵك سەرەی گرتووە ، ناوی نووسیوە لەزۆر دەزگادا ، دەزگایەك هەیە (B.B.L)ی پێ دەڵێن-(٣٠٠) تاقیگەی هەیە تەنها (U.S.A) بۆ ئەم ئەزمونکردنانە جیناتی مرۆڤ دەگوازنەوە بۆ ئاژەڵ بۆ حەشەرات بۆ میکرۆبات ) خەریکی ئەم ئەزمونانەن بۆ نمونە-ژن و مێردێك کچێکیان هەیە تەمەنی (٦) ساڵە شێرپەنجەی ئێسقانیەتی ناوی خۆیان نووسیوە بۆ ئەوەی خێرا فۆتۆکۆپیەکی کچەکەیان بکەن و منالێك دەربچێت وەکو منالەکەی خۆیان بۆ ئەوەی کە گەورە بوو ئێسقانەکانی دەربهێنن و بۆ کچەکەیانی بەکار بهێنن جا مەترسیەکی زۆریش هەیە لەمەدا زاناکان دەڵێن : (٥٠) هەزار تا (١٠٠) هەزار (جین) لە مرۆڤ دا هەیە زۆربەی کەشف نەکراوە چونکە سستن ئەگەر بوروژێنرێت نازانین چی روودەدات لەوانەیە بوونەوەری سەیر دەربچێت [1]

---

[1] کۆ باسەکانی میحراب بەرگی ١-ل-٢٨١

-ئەم فۆتۆکۆپی کردنەی مرۆڤ کارەساتێئی گەورەیە و دەردێکی زۆر کوشندەیە بۆ هەموو دانیشتوانی سەر زەوی

-بۆیە شەریعەتی ئیسلام بە حەرامی داناوە ئەگەر بە هەر ناوێکەوە بکرێت وەکو زانای ناودار-عبدالقدیم زلوم- لە (حکم الشرع فی الاستنساخ) دا دەفەمووێ-حەرامە و کارێکی ناپەسندە دەرهەق بە مرۆڤ بکرێت-لەبەر ئەو خاڵانەی خوارەوە:

١-لەبەر ئەوەی بەدەستهێنانی منالە بە پێچەوانەی ئەو رێگە سروشتیەی کە خوای گەورە دایناوە و سروشتی مرۆڤەکانی لەسەر راهێناوە بۆ زیادبوونی وەچە .

وەکو دەفەرمووێ :﴿ الم يك نطفة من مني يمنى ثم كان علقة فخلق فسوى فجعل منه الزوجين الذكر والانثى﴾ القيامة٣٧-٣٩ واتە : باشە ، ئایا کاتی خۆی نوتفەیەك نەبووە لە مەنی کە دەرژێنرایە شوێنی خۆی (کە منال دانە) پاشان خۆهەڵواسەرێك بوو گەشەی کردوو ڕوح و دەزگاکانی دەرەوەو ناوەوەی بە رێك و پێکی پێبەخشی .

ئینجا هەر لەو مەنی یە هەردوو جووت نێر و مێ ی دروست کردوە (کە تەواو کاری یەکترن).

-وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ :﴿ وانه خلق الزوجين الذكر والانثى من نطفة اذا تمنى﴾ النجم٤٥-٤٦ واتە : هەر ئەو زاتە (خوای گەورە ) دوو جۆری دروست کردووە کە نێر و مێیە... لە نوتفەیەك (لەخالێکی زۆر بچوك ،ئەویش ئەگەر ویستی خوای گەورەی لە سەر بێت ) کاتێك لە جێی خۆیدا دادەنرێت .

٢-نەبوونی باوك بۆ ئەو منالّە فۆتۆکۆپی کراوانەی کە لە ئافرەتدا دەکرێت بەبێ بوونی رەگەزی نێر-پیاوبگرە زۆر جار لە ئافرەتێکەو -خلیە)خانە وەردەگرن و لە رەحمی ئافرەتێکیتردا دەیچێنن-ئەمەیش لە دەستدانی رێز و کەرامەتی مرۆڤە و پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی خوا کە دەفەرمووێ:﴿یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی . . . ﴾حجرات-١٣ واتە : ئەی خەلکینە ئێمە دروستمان کردوون لە نێر و مێیەك (کە ئادەم وحەوایە).

وەیا دەفەرمووێ:﴿ادعوهم لآبائهم هو اقسط عند الله﴾ الاحزاب-٥ واتە : ئەو کورانە بەناوی باوکیانەوە ناویان بەرن و بانگیان بکەن ، ئەوە پەسەندە لای خوا.

٣-دەبێتە هۆی لەدەستدانی (نەسەب)لە کاتێکدا ئیسلام پاراستنی ئەو بوارەی بەواجب گێڕاوە .

وە شێوازێکی تری لەدەستدانی نەسەب تێکەڵ بوونیەتی بەسەر یەکدا ئەویش بەوەی هەر سیفەتە و لە پیاوێکەوە وەری دەگرن بۆ نمونە سیفاتی چاو لە پیاوێکەوە و سیفاتی رەنگی قژی سەر لە کەسێکی تر و پاشان منالّێکی خوازراو دەردەچێت ئەمەیش لەدەست دانی نەسەبە وەکو پێغەمبەر فەرمووی:

لەوکاتەی ئایەتی (ملاعنە)هاتە خوارەوە : (ایما امراة ادخلت علی قوم نسبا لیس منهم فلیس من الله في شئ ولن یدخلها الله الجنة وایما رجل جحد ولده وهو ینظر الیه احتجب الله منه و فضحه علی رؤس الاولین والاخرین) _ رواه الدارمي واتە : هەر ئافرەتێك منالّی خۆی

بداتە پالْ نەتەوەیەك كە لەوان نەبێت ئەوە ئەو ئافرەتە لای خوا هیچی بۆ نیە و وە خوای گەورە نایكاتە بەهەشتەوە ، وە هەر پیاوێكیش نكولّی لە منالّی خۆی بكات لە كاتێكدا كە ئەو لای روونە كە ئەوە منالّی خۆیەتی ،ئەوە ئەو كەسە بێبەش دەبێت لە بینینی خوا لە قیامەتدا ، وە ریسوای دەكات لە بەر چاوی هەموو خەلّكی قیامەت .

٤-دەبێتە رێگر لەبەردەم جێبەجێ بوونی زۆربەی حوكمە شەرعیەكانی-وەكو ژن و ژن خوازی و خزمایەتی و باوكایەتی و بەخێوكردن و میرات گرتن و چەندانی تر لەو ئەحكامانەی كە ئیسلام گرنگی پێداوە [١]

-ئەمە بە نسبەت فۆتۆكۆپی كردنی مرۆڤ بەلاّم كۆپی كردنی رووەك لەرووی شەرعەوە (والله اعلم) هیچی تێدا نیە و دروستە وە لە ئاژەلّیشدا هەر دروستە مادام بۆ چارەسەركردنی نەخۆشیەكانی مرۆڤ بێت [٢]

جێبەجێ كردنی ئەم كرداره لەسەر ئاژەلْ پەیوەندی بەپێوانەی رەوشتی یەوەنی یە چونكە ئاژەلْ كەسێتی نی یە رەچاوبكرێت،لەوانەیە وێنەگرتنە وەی ئاژەلْ چارەسەرێك بێت بۆ ئاستە نگە مرۆیی یەكان وەك برسێتی و هتد ........ [٣]

---

[١] حكم الشرع في الاستنساخ-ل-٢٣-الى-٢٥

[٢] حكم الشرع في الاستنساخ .

[٣] گۆڤاری -الطبيب - ملحق المجلة الطبية العراقية ١٩٩٧

# ئاینی ئیسلام و پێشکەوتنی زانست :

یەکێك لەو خەلاّتانەی کە خوای گەورە بەمرۆڤی بەخشیوە و کردویەتی بەمایەی جیابونەوەی مرۆڤ لەسەر جەم دروست کراوەکانی تر بریتییە لە (عقل) ژیری وەهەر کەسێك بەکاری نەهێنێ و نەیخاتە گەر بۆ بیرکردنەوەو داهێنانی نویّ- لێ پرسینەوەی قورس و توندی لەگەڵ دا دەکرێت لەپاشەرۆژ دا ) تەنانەت خوای گەورە لەبارەی کۆمەڵێکەوە کەدەخرێنە دۆزەخەوە دەفەرمویّ ئەوانەن چاویان هەبوە پێیان نەبینیوە و گوێیان هەبوە پێیان نەبیستوە و ژیری و دڵ یان هەبووە بیریان پیّ نەکردۆتەوە زانای ناوداری ئیسلامی (د.نصر فرید واصل )دەڵێ: ئاینی پیرۆزی ئیسلام پشتگیری لە زانستێك دەکات کە خزمەتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بکات و ببێتە مایەی پێشکەوتنی کۆمەڵگە، وە خوای گەورە ڕێزی تایبەتی داناوە بۆ زانست و زانایان، بە شێوەیەك کە زانایانی کردۆتە ڕیزی فریشتەکانی خۆیەوە، وە زانستیش کاتێك خزمەت دەکات کە لەسەر هەر سیّ بنەمای ئیمان و ئیسلام و خزمەت کردن بە مرۆڤ دامەزرابێت و پارێزگاری لە ئاین و مرۆڤ و ڕەچەڵەك ژیری و سامان بکات، ئەگەر یەکێك لەو پێویستییە سەرەکی و بنەڕەتیانە پشتگویّ بخات کە خوای گەورەو کار بەجیّ دایناوە ئەوا دەبێتە مایەی کون کردنی کەشتی ژیان و مرۆڤایەتی بەرەو تیاچوون دەبات.

وه هـەروەها ( زانـای نـاوداری ئیـسلام د- یوسـف القرضـاوی - لـەم بـارەو دەفـەرموێ - ئـاینی پـیرۆزی ئیـسلام دەرگـای والأدەکـات بـۆ پێـشکەوتنی زانـست بـەڵکو ئـەم پێـشکەوتنە بەئـەرکێکی ئـاینی و پێویستی یەکی واقعی دادەنێت .

ئیسلام پێشوازی لەزانست دەکات بەلاّم کام زانست ؟

زانـستێك کـە لـە خزمـەت و بەرژەوەنـدی ئینـسان و ئـەخلاق و بـەها بالأکانی مرۆڤ دا بێت . ئەمەش ئەو زانستەیە کەخوای گەورە هـەڵگرو جێ بەجێ کاری دەباتە رێزی فریشتەکانی خۆی هـەروەك دەفـەرموێ ﴿ شهد الله انه لا اله الا هو والملائكة واولوا العلم قائما بالقسط لا اله الا هو العزيز الحكيم ﴾ ال عمران (٨) واتە : خوای گەورە (لە رێی دروست کراوانیـەوە ، کـە هـەمووی نیشانەی دەسـەلاتی دەنوێنێـت)خـۆی شـایەتی داوە و دەریخستووە و سەلماندوویەتی کە بەراستی جگە لەو هیچ خوایـەکی تـر نیـە کـە شـایەنی پەرستن بێـت ، هـەروەها فریـشتەکان و خـاوەن زانستەکانیش (لـە پێغەمبـەران و زانایـان ) کـە بـە رێگەیـەکی راسـت و دروسـت دەیـسەلمێنن خـوا هەمیـشە دادپـەروەری ڕەهایـەو جگـە لـەو زاتە خوایەکی تر نیە و ئەو خوایەکی بالأدەست و دانایە.

وەهەروەها پێغەمبەریپێشەوا (ﷺ) لـەبارەی زانستەوە دەفـەرموێ : (**فضل العالم على العابد كفضلي على ادناكم** ) . واتە: فەزڵ و رێـزی زانایـان بەسـەر عابـدان دا وەکـو رێـزی مـن وایـە بەسـەر سـادەترین ی ئێوەدا .

هەڵوێستی مرۆڤ بەرامبەر بەزانست پێویستە وەکو هەڵوێستی پێغەمبەری خوا سلیمان (عليه السلام)– بێت کە زانستی لە خزمەت کردن بە ئیمان و بروادا بەکار دەهێنا وەکو خوی گەورە دەفەرمویٚ لە بارەی سلیمان :–

﴿ایکم یاتیني بعرشها قبل ان یاتوني مسلمین ، قال عفریت من الجن انا اتیك به قبل ان یرتد الیك طرفك ﴾( النمل ، ٣٨ واتە : (سولەیمان زانی هەرەشەکەی کاریگەر دەبێت بۆیە ڕوو بە ئەندامانی حکومەتەکەی ) وتی : ئەی خەڵکینە کامتان دەتوانێت تەختی شاژنە بەڵقیسم بۆ بهێنێت پێش ئەوەی بێت بۆ لام و تەسلیم بێت .

دێویك لە پەریەکان وتی : من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی دەوام تەواو بێت و لەجێی خۆت هەستیت ، بە ڕاستی من بۆ ئەو کارە خۆم بە بەهێز و ئەمین دەزانم ، (بەلاٚم یەکێك لە پیاو چاکان ) کە زانست و زانیاری لە (نەهێنیەکانی) کتێبی تەورات هەبوو وتی : من بۆت دەهێنم بە چاوتروکانێك....

–ئەم ئایەتانەش دەربارەی هێنانی عەرشی شاژنە (بلقیس ) شاژنی ( سە بەء ) ە لەیەمەن ، کاتێك کە(سلیمان ) پێغەمبەر (عليه السلام) عەرشەکەی بینی لای خۆی دەست بەجیٚ :–

فەرمووی :﴿هذا من فضل ربي لیبلوني أأشکر ام اکفر ومن شکر فانما یشکر لنفسه ومن کفر فان ربي غني کریم ﴾النمل ٤٠ واتە : ئەمە لە

**فەزڵ و بەخششەکانی پەروەردگارمە بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە ..کە :ئایا سوپاس گوزار دەبم یان نا شوکر و بەد نمەك ..**

**– کەواتە پێویستە (زانست) لە خزمەتی (ئیمان)دابێت ، ئیمانیش کۆنترۆڵ و رێنمایی زانست بکات بۆ بەکار هێنانی لەپێناو بەرژەوەندی مرۆڤدا .**

**ئەرکی زانست لەشارستانیەتی ئیسلامی دا ئەوەیە کەبنیاتنەرو ئاوەدان کاربێت نەك وێران کەر و تێکدەر بەڵام بەداخەوە ئەمرۆ شارستانیەتی نویٚ دەبینین پابەند نیە بەبەهارەوشتی وئیمانیەکانەوە ، چەکی ئەتۆمی و جەرسومی و کیمیاویش زادەی ئەو شارستانیەتەن .**

**–ژیاری رۆژئاوا هەمو بەهایەك لەم جۆرە زانستانەوە وەردەگرێت ، بەڵام ئێمەی موسوڵمان و ئیماندار بەها لەدینەوە وەردەگرین دینیش لەوەحی یەوە هاتوە ، وەحی لەخواوە هاتوە خوای گەورەش پەروەردگاری هەموو جیهانە بۆیە زانستێك کەلە سنوری رەوشت دەربچێت ، زانستێك کەلە سنوری بەهاکانی خوای میهرەبان دەربچێت ، زانستێکی زەرەرمەندە ، زانستێکی وێران کارە . دەبیٚ ئەوەش بزانین کە زانستی فۆتۆکۆپی کردنی مرۆڤ جیایە لەگەڵ (خلق) دروست کردندا جونکە دروست کردن (خلق ) تەنها ئیشی خوای میهرەبانە کە لە نەبون (مخلوقات) بەدی دەهێنێت وەکو خوای**

گەورە دەفەرموێ : ﴿لا یخلقون شیئاً وهم یخلقون ولا یملکون لأنفسهم ضراً ولا نفعاً ولا یملکون موتاً ولا حیاةً ولا نشوراً﴾ فرقان _٣

واتە : ئەوان هیچ دروست ناکەن و هیچیان پیٚ بەدی ناهیٚنریٚت ،بەڵکو ئەوان خۆیان دروست دەکریٚن (تەنانەت)ناتوانن سودیٚك یان زەرەریٚك بە خۆیان بگەیەنن،هەروەها نە مردنیان بەدەستە نە ژیان ، نە زیندوکردنەوە.

بەلاّم ئەو کارەی کە ئەوان دەیکەن و دەستیان داوەتیٚ دەست کاریکردنی بونەوەری خوایەو بەکارهیٚنانیەتی لەپیٚچەوانەکەی داو ئەگەر بەردەوام بن لەسەری ئەوا کارەساتی گەورە بەرپادەبیٚت و هەموو مرۆڤایەتی دەبیٚباجەکەی بدەن چونکە ئەوە دەست کاری کردنی بەرنامەی خوایە وەکو خوای گەورە دەفەرموێ رۆژیٚك دیٚت شەیتان فەرمان دەکات بە ئەو لیاکانی خۆی کەدەست کاری بەرنامەی خوابکەن﴿ولآمرنهم فلیبتکن اذان الانعام ولآمرنهم فلیغیرن خلق الله﴾ النساء ١١٩ واتە : خۆم فەرمانیان پیٚدەدەم و هانیان دەدەم و ئەو جا ئەوانیش بیٚگومان گویٚی ئاژەڵەکانیان دەبڕن و ، هەروەها فەرمانیان پیٚدەدەم ئەوانیش دروست لەم سەردەمەدا ئەلقە لە گویٚکانی بە ناو زانا دەستکاری جینات و سیفاتی ڕەچەڵەکی دەکەن و بەگویٚی شەیتان و شەیتان سیفەتان دەکەن ، ئادەمیزاد و زیندەوەران تیٚك دەدەن .

سەرەڕای ئەمەش هیٚشتا لەنیٚوان زانایانی زانست و زانایانی ئاینیدا خاڵی هاوبەش هەیە کە پیٚویستە سنوریٚ هەبیٚت و نابیٚت ببەزیٚنریٚت

لەمەڕ جێبەجێ کردنی فۆتۆکۆپی کردن بەسەر مرۆڤدا چونکە کۆمەڵێك مەترسی رەوشتی و ئاینی و یاسایی و کۆمەڵایەتی لە پشتەوەیە .

## بۆیەکەم جار کۆپی کردنی مرۆڤ لە لایەن ڕائیلییەکان

ئەوشتەی خەڵکی لێی دەترسان و ترس و بیمی لە دڵی دانیشتوانی سەر زەویدا دروست کردبوو کە بریتی بوو لە فۆتۆکۆپی کردنی مرۆڤ – لەدەوروبەری ساڵی ٢٠٠٣ – دا لەسەر دەستی – تایفە یەك بەناوی – **رائیلیەکان** – بۆ یەکەم جار راگەیەندرا

ئەم تایفەیە(رائیلیەکان) کۆمەڵێکن لەسەر دەستی پیاوێکی رۆژنامە وانی فەرەنسیەوە بەناوی (کلۆد فۆریلۆن ) –دامەزراون لەساڵی ١٩٩٧ – کرا بەدەزگای (کلۆنیە ) دامەزرێنەری ئەم دەزگایە خۆی بەپێغەمبەر دەزانێ و داوا دەکات کەتەورات و ئینجیل بەشێوەیەکی زانستیانە لێك بدرێنەوە ژمارەیان لەجیهاند بەپێ راگەیاندنەکانیان (٥٥) هەزار کەسە و ئێستا ناوەندی چالاکی یەکانیان لەولاتی کەنەدایە، شایانی باسە ڕائیلیەکان بە ئەسڵ جولەکەن.

لە رۆژی ٢٠٠٢/١٢/٢٧ بۆ یەکەم جار لەدایك بونی مناڵێك بەرێگەی فۆتۆکۆپی کردن لەلایەن ڕائیلیەکان ڕاگەیەنرا ،بەلام سەرۆکی

پـەیمانگای (ڕۆزالـین) کەهەسـتان بـەفۆتۆکۆپـی کردنـی (دۆلی ) دەڵـێ رائیلیـەکان هـیچ بەڵگـەیکیان نەخـستۆتە رو دەربـارەی دو منالّــە کۆپیکراوەکە و پێم وایە ئەوە تەنها فرو فێڵە ئەوان بلآویـان کـردەوە ئەگەر راستیش بێت دبێ رابگیرێت و قەدەغەبکرێت .

## مەتـرسیە جۆراوجۆرەکانی
## کۆپی کردنی مرۆڤ

ئەو کۆپـی کردنەی مرۆڤ کە ئێستا خەڵکی سـەرقاڵ کـردووە و بـاس و خواسی لێوە دەکرێت، ئەگەر جێبەجێ بکرێت، چەندین شوێنەواری خراپ و مەترسی دار بەرپا دەکات لە بوارەکانی :

**١- لە ڕووی شەرعی**

کۆپی کردنی مۆرڤ چەندین مەترسـی جۆراوجۆری لـە ڕووی شـەرعی لێدەکەێتەوە وەکو :

ا- تێکـەڵ بـوونی ڕەچـەڵەك و نـەمانی باوکایـەتی و خزمایـەتی کـە شەریعەتی ئیسلام زۆر جەختی لەسەر دەکاتەوە.

ب- نەمانی ئەو جیاوازییە ڕەنگ و ڕووی و شکلّ و شێوەییەی کە یەکێکە لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای گەورە.

ج- پێچەوانەیە لەگەڵ دیاردەی ژن و مێردایەتی کە سروشـتی مـرۆڤ داوای دەکات.

و- دەست کاری کردنی خەڵقی خوایە.

**٢- لە ڕووی تەندروستی**

**کۆپی کردنی مرۆڤ گەورەترین مەترسی بۆ سەر تەندروستی خاوەنەکەی دروست دەکات، چونکە کۆپی کردن لەخانەی لاشەوە دەکرێت خانەش هەڵگری هەموو سیفاتە بۆماوەییەکانە ئەمیش وادەکات کە هەموو نەخۆشیەکانی خاوەن خانەکە بۆ کۆپی کراوەکە بگوازرێتەوە جگە لەمەش ئەو خانەیەی کە دەشێ بۆ کۆپی کردن زانایانی بۆماوەیی (علماء الوراثة) دەڵێن: ئەو خانەیەی کە کۆپی کردنی مرۆڤی لێوە دەکرێت دەبێ خانەیەك بێت تەواو پێگەیشتبێت و بەرەو پیری چووبێت، ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی لە ڕووی تەندروستی لەسەر ژیانی کۆپی کراوەکە دەبێت لە داهاتوودا چونکە هەم لەڕووی بۆماوەیی (وراثة) هەڵگری هەموو سیفاتە بۆماوەییەکانە و هەم لەڕووی تەمەن پیر بووە زانایانی بواری (وراثة) بۆماوەیی دەڵێن هەموو خانەیەکی زیندوو لە مرۆڤدا تەمەنێکی دیاری کراوی هەیە وەکو مرۆڤ، دوایی دەمرێت.**

**٣- مەترسی کۆپی کردن لەڕووی کۆمەڵایەتی**

**کۆپی کردنی مرۆڤ لەڕووی کۆمەڵایەتی مەترسی زۆری هەیە لەوانە :**

**أ- لە دەست دانی ئەو سۆز و بەزەیی و خۆشەویستیەی کە لەنێوان مرۆڤەکاندا هەیە. وەکو خوای گەورە دەفەرموێ**﴿والله جعل لكم من انفسكم ازواجاً وجعل لكم من ازواجكم بنين وحفدة ورزقكم من الطيبات افبالباطل يؤمنون وبنعمت الله هم يكفرون﴾النحل- ٧٢ **واتە : خوا هەر**

لـــە خۆتـــان هاوســـەرانی بـــۆ فەراهـــەم هێنـــاون ، هـــەر لـــەرێی هاوسـەرانتانەوە كـوڕ وكـوڕەزای پـێ بەخـشیون و لـە هـەموو رزق و رۆزیـەكی چـاك وپـاك و بەسـود بـەهرەوەری كـردوون ،(لەگـەڵ ئـەو ڕاستیانە دا )ئایا ئەوانە هەر بڕوا بە شتی پووچ وناهەقی دەكەن و لەبەرامبەر نازو نیعمەتەكانی خواوە ئەوانە هەر ناشوكرو نا پەزێری وبێ باوەڕ دەبن ؟

ب- لاواز بوون و نەمانی پەیوەندی كۆمەڵایەتی لە نێوان مرۆڤەكاندا.

گـەورەترین مەترسـی كـۆپی كردنـی مـرۆڤ نـەمانی ئـەو پەیوەندیـیـە بەهێزە خواكردیەیە كە لە نێوان مرۆڤەكاندا هەیە. وەكو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿یاایها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثی وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عندالله اتقاكم﴾ الحجرات - ١٣ واتـە: ئـەی خەڵكینــە ئێمــە دروســتمان كــردوون لــە نێــرو مێــەك (كــە ئــادەم وحەوایە)وە كردوومانن بە چەند گەل وهۆزێك تا وەكو یەكتری بناسن وە ئەوەش بزانن كە بەرێزترینتان لەلای خوا پارێزگارەكانتانن .

٤- مەترسی كۆپی كردنی مرۆڤ لەڕووی دەرونی.

بێگومـان كـۆپی كردنـی مـرۆڤ مەترسـیـیەكی گـەورەی هەیـە بـۆ سـەر لایـەنی دەروونـی مـرۆڤ، چونكە سروشـتی ئـەم مرۆڤە وایـە لەناخیـدا خـودی خـۆی خـۆش دەوێـت ئەمـەش پـاڵی پێـوە دەنـێ بـۆ خـۆش ویستنی ژیان و حەز كردن بەمانەوە تێیدا، بەرێگەی منداڵ و نەوەكان.

ئەمەش تەنها بەڕێگەی ژن و ژن خوازی دەبێت کە خوای گەورە دایناوەو لە ئیسلامدا گرنگی یەکجار زۆری پێدراوە.

**٥- مەترسی کۆپی کردنی مرۆڤ لەڕووی یاسایی**

کۆپی کردنی مرۆڤ مەترسی بۆ سەر هەموو ئەو یاسا و دەستورە کۆمەڵایەتیانە هەیە کە ئێستا بوونیان هەیە لەڕووی سیاسی و مەدەنی و جینائی و دەوڵەتیەوە، چونکە هەر یەکێك لەمانە داخوازی چەندین یاسایی تایبەت و پێکەوە گرێدراوە و دەستکاری کردنیان هەروا ئاسان نیە و کێشەیەکی گەورەی یاسایی دروست دەکات، بۆ نمونە:

ا- ئەگەر هاتوو خانەی وەرگیراو لە لاشەی ڕەگەزی مێ (انثى) وە وەرگیرا ئەوا منالەکە هەر لەڕەگەزی مێ دەبێت و ئەگەر لە ڕەگەزی نێر (ذکر) وەرگیرا منالەکە نێر دەبێت، لەو کاتەدا دەگونجێ لایەنێك لەو دوو ڕەگەزە لە ڕووی ژمارەوە زاڵ بکرێت بەسەر ئەوەی تریاندا، بێگومان ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر بواری کۆمەڵایەتی و دارایی و کەسایەتی و ڕەگەزی و هتد ...... دەبێت و مەترسی گەورەش ڕوو لە یاسا دەکات بۆ ڕێکخستنەوەی جارێکی تری هەموو ئەو بوارانەی کە باسمان کرد.

ب- هەریەکە لەو خانانەی کە لە لاشەی مرۆڤدایە هەڵگری هەزارەها (جینات)ن، کاتێکیش کە خانەکە وەردەگیرێت و یەکدەخرێت لەگەڵ هێلکۆکەی ئافرەتدا بەهۆی ووزەی دەزگایەکی کارەبایی ناتوانرێت دیاری بکرێت و بزانرێت کە ئایا ئەو جیناتە هەڵگری نەخۆشیە

زگماکیەکانە یان نا ئەمەش مەترسی ئەوەی لێدەکرێت کە مەخلوقاتی کەم ئەندام و شێواوی وادەربچێت کە هەرگیز نەبینرابێت یان نەخۆشی وادەربکەوێت کە هەرگیز نەبیسترابێت ئەمەش جارێکی تر چەندین کێشەو مەترسی جۆراوجۆر بۆ یاساکان دروست دەکات.

ج- خانەکانی لاشەی مرۆڤ هەریەکەیان هەڵگری هەموو سیفەتە بۆماوەییەکانە و جگە لەمەش ئەو خانەیەی کە بۆ کۆپی کردنی مرۆڤ دەبێ وەربگیرێ دەبێ لە خانەی پیر و بەساڵاچووەکان بێت ئینجا دەشێ بۆ کۆپی ئەگەرنا نابێت و دەرناچێت. کەوابوو دەبێ چ ژیانێك لەو بوونەوەرە تازە کۆپی کراوە چاوەڕوان بکرێت؟ دەبێ منداڵێکی تازە لەدایك بووی بەڕواڵەت و پیر و بەساڵاچووی لە ناوەڕۆك و ناخدا چەند و چۆن بژیێ؟

٦- لە ڕووی ئەمنی و ئاسایشیدا :

دیارە کۆپی کردنی مرۆڤ لە بواری ئەمنیشدا زۆر مەترسیدارە بۆیە هەندێك لە پیاوانی پۆلیس و یاسا پێیان وایە ئەم کارە گەورەترین مەترسی بۆ سەر ئاسایشی کۆمەڵگاکان دروست دەکات لە ڕووی تاوان کاری و خراپەکردندا.

دکتۆر عصام رمضان امین - دەڵێ : مرۆڤی کۆپی کراو لە هەموو ڕوویەکەوە هاوشێوەی ئەو کەسەیە کە (ناوکە) کەی لێوەرگیراوە لە ڕووی شکڵ و شێوەو ڕەنگ و ڕوو هەڵس و کەوت و سیفاتە بۆماوەییەکان .... هتد ، تەنانەت لە پەنجە مۆریشدا هاوشێوەن ئەمەش گرفتی گەورە لە ڕووی ئاسایش دروست دەکات و دەرگا بە

ڕووی تاوان کاری دا دەکاتەوە چونکە تاوانبار زۆر بە ئاسانی دەتوانێ خۆی ڕزگار بکات لە دەستی یاسا.

## کاردانەوەکان

لەگەڵ بڵاوبونەوەی هەواڵی لەدایك بونی یەکەم مرۆڤ بەرێگەی فۆتۆکۆپی چەندین کاردانەوەی توندو نارەزایی دەربرین لەلایەن سیاسەتمەداران و لایەنگیرانی ئەخلاق و فەیلەسوفەکانی جیهان بەتایبەت زانایانی ئەخلاق کاردانەوەی توند وبەرچاویان نیشانداو داوایان کرد ئەم کارە لەسەرانسەری جیهان دا بەنایاسایی ڕاگەیەندرا [-١-]

-جامیعەی ئەزهەری میصری وپاپای ڤاتیکان رەخنەیان لەم کارە گرت وبە دژایەتی ئاین و بەها رەوشتیەکانیان ناوبرد.

وەزیاتر لە (٤٠) ولاّتی ئەوروپی کاری فۆتۆکۆپی کردنی مرۆڤیان بەحەرام داناو دەڵێن سوکایەتی کردنەبەمرۆڤ و داواشیان کردوە ئەم کارە قەدەغەبکرێت.

---

-١- گۆڤاری هەمشەهری



وێنەی (دۆلی) لەتەمەنی (٨)مانگیدا

-دکتۆرەکانی بەریتانیا دەڵێن فۆتۆکۆپی کردنی مرۆڤ دەبێتە هۆی پیربوونی پێش وەختەو لەرووی ئەخلاقیشەوە باش نیە .
-بۆیە (دۆلی ) توشی چەندین نەخۆشی جۆراوجۆر بوەو لەتەمەنی دوو ساڵی دا وەکو ئەوە وابوو ( ٢٠ ) ساڵ بێت.

*ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکی یاسا و بڕیارێکی تاوتویٚ کرد سەبارەت بە کۆپی کردنی مرۆڤ و مەترسی‌یەکانی ئەوە بوو بە زۆرینەی دەنگ بڕیاری قەدەغەکردنی کۆپی کردنی مرۆڤیان داو بە کارێکی نامرۆڤانەیان ناوزەند کردو بڕیاریان دا سزای سەرپێچی کاران بدریٚ بە غەرامە کردن بە بڕی یەك ملیۆن دۆلار و بەند کردن بۆ ماوەی (١٠) ساڵ.

* دەستەیەك لە زانایان داوایان کرد کە زانایانی دەزگای (مافریك) کە هەڵدەستن بە کۆپی کردنی مرۆڤ قەدەغە بکرێن.

وە زانای ناودار (لورد برت مایی) سەرۆکی کۆمەڵەی (الملکیە) دەڵیٚ : بەڕاستی گاوان و شوانەکان ئەوانەی کە هەڵدەستن بە کۆپی کردنی مرۆڤ بونەتە هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو ئاشوب و دەنگۆفرانەی ئێستا سەری هەڵداوە بۆیە پێویستە بە زوترین کات ڕێگری بکرێن .

وە هەروەها زانای ناوبراو بەشداری لەگەڵ دەستەیەك لە گەورە زاناکان کرد لە نووسینی داوایەك کە پێشکەشی کەناڵەکانی

ڕاگەیاندنیان کرد بۆ ڕاگراتن و بڵاونەکردنەوەی هەر دەنگوباسێك کە پەیوەست بە دیعایە و پڕوپاگەندەی کۆپی کردنی مرۆڤ بێت.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەنگۆی یەکەم کۆپی کردنی مرۆڤدا (جۆرج بۆش)ی سەرۆکی ئەمریکا داوای لە کۆنگرێسی ئەمریکی کرد کە هەوڵی کۆپی کردنی مرۆڤ قەدەغە بکەن و بەربەست لەبەردەم ئەو زانستە وێرانکارو دوور لە ڕەوشتیەدا دابنێن.



یەکێك لە زانایانی بواری کۆپی کردن، کە چەندین ساڵە بەشداری لە هەوڵەکانی کۆپی کردنی مرۆڤدا دەکات

*لەگەڵ بڵاوبوونەوەی وێنەی (دوڵی) :پەرلەمانی نەرویجی بڕیارێکی دەرکرد کە تێیدا هەموو شێوازەکانی کۆپی کردنی مرۆڤی ڕەتکردەوەو داوای ڕاگرتنی دەست بەجێی کرداری کۆپی کردنی کرد.

* لەهەمان ڕۆژ سەرۆکی فەرەنسا داوای لەئەنجومەنی ڕاوێژکاری نەتەوەیی بۆ ڕەوشت کرد کە چاوێك بە یاسای فەرەنسیدا بخشێنێتەوە تا دڵنیابێ لەوەی ئەو کون و کەلەبەرانە گیراوە یان نا کە بیرۆکەی کۆپی کردنی مرۆڤی لێوە دێتە ژوریێ بۆ ناو فەرەنسا.

* سەبارەت بەمسوڵمانانیش ناڕەزاییەکی توند لەلایەن جیهانی ئیسلامی بەرزبووەوە و ئەوە بوو لەچەندین وڵات موسڵمانان خۆپیشاندانیان ساز کردو ئەو کارەیان مەحکوم کرد. لەسەر

هەڵوێستی فیقهی ئیسلامیش لەبەرامبەر کۆپی کردنی مرۆڤدا ، ئەوە بوو (منظمة الاسلامية للعلوم الطبية) داوای گرێدانی کۆنگرەیەکی کرد کە لەزانایانی شەرع ناس و پزیشکانی تایبەت مەندی لێکۆڵینەوە لەسەر کۆپی کردنی مرۆڤ پێك بێت، ئەوە بوو لەحوزەیرانی ساڵی (١٩٩٧) لە (دار البیضاء)ی وڵاتی (مغرب) کۆنگرەکە گرێدراو ماوەی (٤) ڕۆژی خایاند و زۆر بەچڕوپڕی باس لەکۆپی کردنی مرۆڤ کراو لێکۆڵینەوە لەسەر زیانەکانی و مەترسییەکانی کرا لە ڕووی شەرعی و زانستی و یاسایی و هتد ..

لەکۆتایی کۆبونەوەکەدا ئەم بەلاغەی خوارەوەیان ڕاگەیاند :

١- حەرام کردن و قەدەغەکردنی هەموو شێوازێکی پەیوەندی هاوسەرێتی کە جگە لە ژن و پیاوی یەکتر ، ڕێگەی سێهەم ڕۆڵی تێدا ببینێت. ئیتر ئەو ڕێگەی سێهەمە بەکارهێنانی ڕەحم بێت یان هێلکۆکە یان حەیوانی مەنەوی یان خانە لاشەیی یەکان بێت بۆ کۆپی کردن.

٢- قەدەغەکردنی کۆپی کردنی مرۆڤی ئاسایی، وە ئەگەر لە داهاتوودا دەرکەوت کە (حالات الاستثنائية) هەیە ئەو کاتە دەبێ لێکۆڵینەوەی شەرعی لەسەر بکرێت و لەلایەن زانایانی ئیسلام لە ڕووی دروستی و نادروستی بڕیاری لەسەر بدرێت.

٣- پشتگیری کردنی دەوڵەتان لەسەر دانانی هەر یاسایەکی پێویست بۆ ڕێگە گرتن و داخستنی دەرگاکان بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە ڕووی ئەو کەس و لایەن و دام و دەزگاو دامەزراوە بێگانانەی کە باس و خواسی کۆپی کردنی مرۆڤ دەکەن لەهاتنە

ناوەوەیان بۆ ناو وڵاتانی ئیسلامی، تا ناو موسڵمانان نەکەنە مەیدانی کارەکانیان و برەودان پێی.
٤-چاودێری کردنی (منظمات)ە ئیسلامیە پزیشکیەکان و بوارەکانی تر لەسەر بابەتی کۆپی کردن و بابەتە تازە زانستیەکان لەسەری.
٥- داواکردنی پێکهێنانی لیژنەیەکی بواری ئەخلاقی بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر بواری ئەخلاقی و ئامادە کردنی ڕاپۆرتی تایبەت لەسەر مافەکانی کۆرپەلە.

## هەڵوێستەکان لەبەرامبەر کۆپی کردنی مرۆڤ

لەگەڵ ئەو باس و خواسە گەرم و گوڕەی کە لە ئەنجامی دەنگۆی یەکەم کۆپی کردنی مرۆڤدا بەرپابوو، هەڵوێستەکان جیاواز بوون لە ڕووی قبوڵ کردن و ڕەتکردنەوەی کۆپی کردنی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی سێ هەڵوێستی جیاواز وەرگیرا :
١- هەڵوێستی پسپۆڕان و شارەزایانی بواری چارەسەرکردنی بواری نەزۆکی و منداڵ نەبوون کە پێیان وابوو دەبێ پشتگیری تەواو لە هەوڵی کۆپی کردنی مرۆڤ بکرێ و زیاتر برەوی پێبدرێ چونکە هۆکارێکی باشە بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی نەزۆکی و منداڵ نەبوون.
٢- هەڵوێستی زۆرێك لە وڵاتانی ئەوروپی و ئیسلامی و بەتایبەت وڵاتانی (ئینگلتەرە و ئەڵمانیا و فەرەنسا) وە زۆرێك لە زانایانی ئیسلامی و ئەدەبیەکانی تر ..... و هتد ..........

که پێیان وابوو کۆپی کردنی مرۆڤ دەبێ قەدەغە بکرێت و ڕابگیرێت چونکە دەست کاری کردنی دروست کراوانی خوای گەورەیە و کارەساتی گەورەی بەدوا دادێت، وە نزیکە بونەوەری سەیرو سەمەرەی لێبکەوێتەوە.

٣- هەڵوێستی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بوو بەتایبەت کە پێیان وابوو دەبێ پەلە نەکرێ لە هەڵوێست گرتن لە بەرامبەر کۆپی کردنی مرۆڤدا بەڵکو لێکۆڵینەوەی وورد و چڕو پڕ لە بوارەکانی : کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی و ..... هتد بکرێ و بزانرێ ئایا زەرەرو زیانی زۆرترە یان سوودەکانی پاشان هەڵوێستی لە بەرامبەردا بگیرێ بە قەدەغە کردن یان ڕێپێدان.

# چەند تێبینیەکی گرنگ

کۆپی کردنی مرۆڤ جیایە لەگەڵ (خلق) دروست کردن چونکە (خلق) تەنها ئیشی خوای پەروەردگارە کەلە نەبون مەخلوقات بەدی دەهێنێت بەڵکو کاری کۆپی کردن دەست کاری کردنی بونەوەری خوایە نەك دروست کردن وەکو هەندێك خەڵکی ناحاڵی وای بۆدەچن.
-بیرۆکەی فۆتۆکۆپی کردن ئیمان بەزیندوبونەوەی دوای مردن زیاتر دەکات و ئەو زیندوبونەوەیەی کەبێ باوەڕان باوەڕیان پێی نیەو ئینکاری دەکەن و دەڵێن چۆن ئەو مرۆڤە دوای مردن زیندو دەبێتەوە .

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هو الذي يبدأ الخلق ثم يعيدة وهو اهون عليه﴾ الروم ٢٧
واتە: هەر ئەو زاتە لە سەرەتاوە بەدیهێنراوەکان بەدی دەهێنێت ، پاشان بەجۆرێکی تر دروستیان دەکاتەوە ، ئەو کارەش بۆ خوا ئاسانە .
-پێغەمبەریش دەفەرموێ : لە (عجب الذنب ) وە دروست دەکرێنەوە لە قیامەتدا.
-هەندێك توێژەر دەیانەوێت شەرعیەت بدەن بەم کاری کۆپی کردنە کە گوایە هەوڵ دەدەن وێنەی زاناو فەیلەسوف و ناودارو بلیمەتە لەناو چوەکان ، بەر هەم بهێننەوە ، بەڵام ئەو بیرۆکەیە تەنها خەیاڵە چونکە هەرگیز خانەی مرۆڤی مردوو گەشەی پێناکرێت ٠

## سەرچاوەکان :


- تەفسیری ئاسان ( بورهان محمد امين)
- منهل المؤمنين ( د.محمود احمد البرشه)
- خطب القرضاوي ج٣
- حول هندسة الوراثة وعلم الاستنساخ ( محمد صالح المحب)
- الاستنساخ البشري واحكامه الطبية والعملية في الشريعة الاسلامية ( د. نصر فريد واصل )
- حكم الشرع في الاستنساخ ( د. عبدالقديم زلوم )
- کۆباسەکانی میحراب ( شەماڵ موفتی )
- وێنەگرتنەوەی مرۆڤ لە نێوان تیۆر وپراکتیکدا ( بێخاڵ ابوبکر)
- گۆڤاری (الطبيب)
- گۆڤاری (خاوێن)
- گۆڤاری (هەمشەهری)
- گۆڤاری (گولان)
- ڕۆژنامەی یەکگرتوو
- چەند بابەتێك لە ئینتەرنێت (google,bbc…)

